# ئایەتە ئومێدبەخشەکانی نێو قورئان

نووسینی: ئاسیە حسێن



# ناسنامەی کتێب

ناوی پەرتووک: ئایەتە ئومێد بەخشەکانی نێو قورئان
نووسینی: ئاسیە حسێن
نەخشەسازیی بەرگ: محمد سیانی
نەخشەسازیی ناوەوە: عبداللە خاکی
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی – ٢٠٢٢ میلادی

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە «»ی ساڵی «٢٠٢٢»ی پێ دراوە.

## ســوپاس و پێزانین

✿ سەرەتا سوپاس بۆ خودای گەورە کە یارمەتی دام لە نووسینی ئەم ناميللكە جوان و بەنرخە.

✿ سوپاس بۆ هەموو ئەوانەی کە یارمەتیان دام لە نووسین و رێکخستن و ئامادەکردنی ئەم نامیللکەیە، خودای گەورە پاداشتیان بداتەوە و بۆمان بکات بە توێشووی قیامەت. اللهم امين يارەب.

# پێشکەشە بە

- دایك و باوکی هەمیشە خۆشەویستم کەمنیان پەروەردەکرد بەجوانترین شێوە.
- بە خوشک و برا خۆشەویستەکانم.
- بە هەموو هاوڕێکانم .
- بە هەموو ئەوانەی شەیدای قورئانن و بە دڵ و بەگیان دەیخوێننەوە کاری پێ دەکەن و دەست بەرداری نابن .
- بە هەموو ئەوانەی دڵیان بەقورئان خۆش دەبێت هەتا زیاتر لێی نزیك ببنەوە زیاتر دڵیان ئۆقرە و ئارام دەبێت.
- بە هەموو ئەو کەسانەی  کە لەژیان بێ هیوابوونە.
- بەو کەسانەی کە گرفتارن لەژیاندا و بێ ئومێدی باڵی بەسەردا کێشاون.
- بە هەموو ئەو کەسانەی کە هاوکارم بوون بۆ کاری چاك و خێر.

## دەسپێك

بەناوی خوای گەورەو بێ هاوتا درود و سەلام لەسەر پێغەمبەری خۆشەویستم ﷺ وە لەسەر خانەوادە و شوێنکەوتوانی بێت.
سوپاس بۆ خوای گەورە بەفەزڵ و مننەتی توانیم نامیللکەیەکی کورت و پوخت دەربارەی ئایەتەکانی خوای گەورە بنووسم تاکو ببێتە جێگای ڕەزامەندی خوای گەورە، پاشان سوود و چارەسەری بۆ گشت دڵە بێ هیواکان، بەڵام ئایە بۆچی ئایەتە ئومێد بەخشەکانم نووسی؟! لەبەر ئەوەی لەم سەردەمەدا کێشەو گرفتەکان زۆر بوون دڵەکان هەمیشە هیلاک و بێتاقەتن خەم دایپۆشیوون، بۆیە تەنـها قـورئان چارەسەرێکی موعجیزە ئاسایە بۆ گشت گرفت و کێشەکانمان، وە بۆ ئارامی دڵە ماندووەکان و نەخۆشیە دەروونیەکان.
زانایان دەفەرمووێن: چەندە داوا لەدکتـۆرەکان بکەی ئەو خەمەی دڵت لابەرن، باشتـر نادۆزیتەوە لە قــورئان.

هەروەها احمدی کوڕی حنبل (رحمه الله) دەفەرمووێت: سەردەمێك بەسەر خەڵکیدا دێت، سینەیان لە قورئان خاڵی دەبێت و هیج هەست بە لەزەت و شیرینی خوێندنەوەی ناکەن، ئەگەر کەمتەرخەمی بکەن لە بەرامبەر فەرمانەکان دەڵین: خوا لێبوردە و بەسۆزە، جا ئەگەر حەرامەکانیش بکەن،

دەڵێن: گرنگ ئەوەیە شەریکمان بۆ خوا دانەناوە خوا لێمان خۆش دەبێت، کارەکانیان تەنها ئومێد و خۆزگەیە هیچی ڕاستی تێدا نییە.
کەواتە ئاگاداربن ئەم ئایەتە ئومێد بەخشانە بۆ بڕواداران تۆبەکارانن، کەجگە لەوەی ئومێدی تەواویان بەپەروەردگار هەیە بەڵام لەسزای خواش دەترسن و دەست بەهۆکارەکانیشەوە دەگرن و هەوڵی بۆ دەدەن..!

# ئایە بەختەوەریت دەوێت و نایدۆزیتەوە؟!

وەرن باپێتان بڵێم لەکوێدایە لە قورئاندا بەختەوەری هەیە!

شێخ ابن تیمیة (رحمة الله) دەفەرمووێت: هیچ شتێکم نەبینیوە مێشک و ڕۆح بەتوانا بکات و جەستە بپارێزێت و بەختەوەری دەستەبەر بکات، وەك زۆر تەماشاکردن و خوێندنەوەی کتێبەکەی پەروەردگار.

کە دڵتەنگ بوویت قورئانەکەت بکەوە لە نێوان ئەم دوو پەڕەیەدا دونیایەك ئومێد هەیە، لەبەردەم گەردەلولی خەمدا باشترین پەناگە قورئـانە.! قورئان وتەی خوای گەورەیە بۆیە هەر کەسێك دەیەوێت لەگەڵ خوای گەورەدا گفتوگۆ بکات ئاوا با قورئان بخوێنێت، وە هەرکەسێك خشوع و گەڕانەوەی بۆ لای خوا دەوێت ئاوا با قورئان بخوێنێت، خوای گەورە دەفەرمووێ: (وَقَالَ الرَّسُولُ يَـارَبِّ إِنَّ قَومِي اتَّخَذُواْ هَذَا الْقُرآنَ مَهجُورًا)[1]

واتە: دوای دوورکەوتنەوەی ئوممەت لە قورئان رسول الله ﷺ سکاڵا دەکات و دەفەرمووێ: پەروەردگارا بەڕاستی قەومەکەم وازیان لەم قورئانە هێناوەو پشت گوێیان خستووە و گرنگی پێنادەن.

[1] - (الفرقان/٣٠).

کەواتە ئەی موسوڵمانان دەست بگرن بە قورئانەوە و لێی دوور مەکەونەوە باشترین کارێك بیکەیت خوێندنەوەی قورئانە بە تێڕامان و وردبوونەوە لێی ئـارامی بەختەوەری بەدەست دەهێنێت.

## قورئـانی پیرۆز ئاسانكراوه

(وَلَقَدْ يَسَّرْنَـا الْقُرْآنَ لِلذِكْرِ فَهَلْ مِن مُدَكِرٍ)[١]

وه بەدڵنــیایی ئێمه قورئـانمان ئاسانكردووه بۆ زیــكرو یادكردن و پەندو ئــامۆژگاری وەرگرتن، لەفزو ماناو خوێندنەوەو لەبەركردنمان ئاسان كردووه بۆ ئەوەی كه پەندو ئامۆژگاری لێوەربگرن، ئەگەر خوای گەوره ئاسانی نەكردایه كەس نەیدەتوانی قسەو فەرموودەی خوای گەوره بخوێنێتەوه.

ئایا كەس هەیه پەنــد و ئــامۆژگــاری لێ وەربگرێ و لەتــاوان خــۆی بپارێزێت.؟!

وەڵامەكەی لای خۆتەوە دەست دەكەوێت!.

---

[١] - (القمر/١٧/).

دەست بکە بە دووبــارە ژیانەوەی دڵت بەئایەتە نورینەکانی قورئــان

(كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَى نَفْسِهِ الرَّحْمَةَ)[١]

پەروەردگــار فەرزی کردووە لەسەر خــۆی لەئاقاری ئێوەدا بەڕەحم و میهرەبان بێت.

کەواتە خودایەك ئەوەندە بــەڕەحم بێت بــۆ بەندەکانی چۆن نائــومێد دەبیت؟!

---

[١] - (الأنعام/٥٤/).

(نَبِّئْ عِبادِي أنِّي أنَا الغَفُورُ الرَّحِيم)[1]

بەبەندەکانم ڕابگەیەنە من لێخۆشبوو و میهرەبانــم.

ئەی مرۆڤ ئەگەر تاوانت کردووە نائــومێد مەبە خودا هەمیشە لێخۆشبووی میهرەبانە دەتبورێت!.

[1] - (الحجر/٤٩/)

**(قُلْ لَن يُصِبَناَ إِلاَّ ماَ كَتَبَ اللهُ لَناَ هُوَ مَولاَنَا وَعَلَى اللهِ فَليَتَوَكَّلِ المُؤْمِنُونَ)**[1]

بلّێ هیچ شتێك تـووشی ئێمه نابێ تەنــها ئەوە نەبێ کەخوای گەورە له (لوح المحفوظ)دا نووسیویەتی لەسەرمان وەگۆڕانی بەسەردا نایەت هەر خوای گەورە سەرخــەرو پشتیوان و دۆستمانە، وە ئەوانەی کەباوەڕدارن باکارەکانیان تەنها بە خوای گەورە بسپێرن وە تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستن.!

بەڵاو موسیبەتەکان کەخودا توشمان دەکات هەمووی لەقازانجی ئێمەیە کەواتە دڵخۆشبە و ئارامبگرە لەسەری.

---

[1] - (التوبة/٥١)

(إِنَّ المتُقِينَ فِي مَقامٍ أمِينٍ)[1]

ئەوانەی کە تەقوای خوای گەورەیان کردووە بەدڵنیایی لەناو بەهەشتدا لە شوێنێکدان کەئەمینن!.

ئەوەندە قورس نیە کە تۆ تەقوای خوای گەورە بکەیت ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێکردووی جێ بەجێی بکە ئەوەیشی لێی قەدەغەکردووی وازی لێ بهێنە ئەوکات بەدڵنیایی بەر موژدەکەی خوای گەورە دەکەویت کەبەهەشتی نەبڕاوەیە!!.

---

[1] - (الدخان/٥١)

(وَبَشرِ الصَابِرين)[1]

ئەی ئەوانەی ئارامتان گرتوە، ئاسوودەبن چونکە خودا مژدەی پێداون.!

ئارامگرتن تـاڵە! بەڵام لەکۆتــایدا خودا لەبەرامبەردا شیرینی بەهەشتی پێدەدات!

ئـــارامگرتنێك بــەهەشتی بـــەدوادا بێت!

هەرگیز لێی بێزار نــابم!.

---

[1] -(البقرة/١٥٥).

(فَتَوكَلْ عَلَى اللهِ إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُتَوكِلِّينَ)[1]

پشت بەخوا ببەستە چونکە بــەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کە پشتی پێدەبەستن!.

کەواتە هەمیشە پشت بەخوا ببەستە چونکە هەر کەسێك پشت بەخوا ببەستێ خوای گەورە خۆشی دەوێت!!
هەروەها سەریشی دەخات و لەناڕەحەتی ڕزگاری دەکات.

[1] -(ال عمران/١٥٩/).

(وَلَكِنَّ اللهَ حَبَّبَ إِلَيْكُمُ الإِيمَانَ وَزَيَّنَهُ فِي قُلُوبِكُمْ)[1]

بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست کردوون و لەدڵ و دەرونتاندا ڕازاندویەتیەوە!.

خودایە سوپاس بۆ ئەم نیعمەتی ئیمانە کەپێت داوین و لەدڵماندا خۆشەویستت کردووە! بەڕاستی مژدەیەکی خۆشە بۆ بڕواداران!.

---

[1] -(الحجرت/٧/)

**(لاَ تَحْزَنْ إِنَّ اللهَ مَعَنَا)**[1]

دڵتەنگ مەبن خوا لەگەڵمانە.!

خەم لەدڵ لابە ئەزیزم چونکە خوای گەورە دەفەرموویت:(لا تحزن) واتە: دڵتەنگ مەبە، شەرم ناکەیت چۆن دڵشکاو خەمـبارو دڵتەنگی لە کاتێکدا خوای تعالی بڵێ من هەم!

دڵتەنگی چیت؟!

خوای گەورە نایەوێ بەندەکەی خۆی بەدڵتەنگییەوە ببینێ ئەزیزم.!

---

[1]- (التوبة/٤٠/).

(وَأَطِيعُوا اللهَ وَالرَّسُولَ لَعَلَّكُم تُرْحَمُونَ)[١].
وه گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر بن بێگومان میهرەبانیتان لەگەڵ ئەکرێت!.

هەمیشە گوێڕایەڵی خودا و پێغەمبەر(صل الله علیه وسلم)بکەن و گوێ بە خەڵکی مەدەن چی دەڵێ یان نا گرنگ ئەوەیە تۆ فەرمانی خواو پێغەمبەرت جێبەجێ کردووە جا ئەوکات بزانە خودا چەندە میهرەبانە لەگەڵت! جائەگەر خودا لەگەڵت میهرەبان بێت چیترت دەوێت.؟!

[١] - (آل عمران/١٣٢/)

(وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُ وَأَنتُمُ الأَعْلَوْنَ إِن كُنتُمْ مُؤْمِنِينَ)[1]

سست و دڵ لاواز مەبن وە غەمبار مەبن هەر ئێوە بەرزو بڵندترن ئەگەر بڕوادارbن.

هەرگیز سستی مەنوێنە لەکردنی عیبادەتەکانت وەدڵی خۆشت لاواز مەکە و غەمبار مەبە کاتێك تۆ دینی خوا جێبەجێ ئەکەیت و دەعوە دەکەیت لەکاتێکدا خەڵکی گاڵتەت پێدەکەن یان قسەت پێدەڵێن چونکە هەر بڕواداران سەرکەوتوو سەرفراز.!

[1] - آل عمران/١٣٩.

(وَجَعَلنَا مِنهُمْ أَئِمَةً يَهْدُونَ بِــأَمْرِنَـا لَمَّا صَـبرُوا وكَانُوا بِــأَيَتِنَا يُوقِنُونَ)[1]
كه ئارامگرتنيان كرده پيشەيان ئێمەش كردمانن به پێشەوا، لەو كاتەی دڵنيايی و برِوايەكی تەواويان هەبوو به ئايەتەكانی ئێمە!.

قەت لەئارامگرتن بێتاقەت و بێزار مەبه هەرچەندە درێژه بكێشێت چونكه پاداشتی ئارامگران بەبێ حيسابه.!

[1] - السجدة/٢٤./

ئەگەر لە هەرشتێك بــێـتاقەت بــووی،
ئەم ئایەتەی خوای گەورە بهێنەوە یــادت کە دەفەرمووێت:
(لَا تَقْنَطُوا مِنْ رَحْمَةِ اللهْ)[١]
هەرگیز نــائومێد مەبن لەڕەحمەتی خودا!.

پـەیــامێکی کــورت
مزگێنیەکی جـــوان
هیـــوایەکی نــەبڕاوە!

[١] - ( الزمر/٥٣).

ئەگەر كەست شك نەبرد وات زانی زۆر تەنهایت ئەم ئایەتەی خوای گەورە بهێنەوە یــادت كە دەفەرمووێت:

(نَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيد)[1]

ئێمە لەوەوە نــزیكترین لەشادەماری ملی!.

---

[1] -(ق/١٦).

ئەگەر بێ هیــوابوویت لــەهێنانەدی خەونــەکانت ئەم ئایەتەی خوای گەورە بهێنەوە یــادت کە دەفەرمووێت:

(ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ)[1]

لێم بپاڕێنەوە وەڵامتان دەدەمەوە.

(واتە: ئەگەر بەیەقین و ترسەوە لێم بپاڕێنەوە منیش وەڵامتان دەدەمەوە).

---

[1] - (غافر/٦٠).

(فَـاذْكُرُونِي أَذْكُــــرْكُمْ)[1]

يــادم بكەن تا منیش لەبیرتان نەکەم!

کەواتە یــادی خودا بکەن لەکاتی خۆشی و ناخۆشیدا خــودا لە بیرمەکە لەهەر کات و شوێنێکدا بیت هەمیشە لە یـادت بێت ئەو کات خــوداش لە بیرتان ناکات!.

[1] - (البقرة/١٥٢)

ئایە دەزانی چـارەسەری هەموو خەمەکانت و دڵـە غەمبارەکەت چـیە؟

(أَلَا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُـلُوبُ)[1]

هـــــەر بـە یـادی خـوا دڵــەکان ئـارام دەگـــــرن!

---

[1] - (الرعد/٢٨)

ئەگەر تــاوانباریت و گوناهت زۆرە،
یــان تاوانێکت کردووە و کەس نەیزانیوە بێ هیــوامەبە هەرچەندە گونــاهەکەت گەورەش بێت!
چونکە خوای گەورە دەفەرمووێت:
(وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِمَنْ تَابَ وَ ءَامَنَ صَلِحًا ثُمَّ اهْتَدَى)[١]
دڵنیاش بـن بەڕاستی من زۆر لێخۆشبووم لەو کەسەی کە تەوبــە دەکات و بــاوەڕ دەهێنێت و کارو کردەوەی چاکە دەکات لەوەو دوا تــادوا هەناسەی ژیــانی بــەردەوام دەبێت لەسەر ئەو ڕێبازە.!

---

[١] - (طه/٨٢).

(قَدْ عَلِمْنَـا مـَا تَنقُصُ الْأَرْضُ مِنْهُمْ وَعِندَنَا كِتَبٌ حَفِيظٌ)[1]

خوای گەورە زانیاری لەسەر هەموو شتێك هەیە، هیچ شتێکی لەحاڵی دروستکراوەکانی لێ ون نابێت.

باوەڕدار چۆن لە ڕێگای ڕاست لادەدات لەکاتێکدا دەزانێت نـامەی کردەوەکانی پارێزەری هەموو کارێکی گەورە و بچووکیەتی!.

قەت خەفەت مەخۆ گەر ستەمت لێکرا یان ئازاریان دای یان قسەیان پێ وتیت چونکە هیچ شتێك لای خوای گەورە ون نابێت!.

---

[1] - (ق/٤).

(سَيَجْعَلُ اللهُ بَعْدَ عُسْرٍ يُسْرًا)[1]

بێگومان خوا دوای تەنگانە ئاسانی دێنێت!.

باوەڕت هەبێت کە ناخۆشیەکانت بەردەوام نابن هەر وەکو چۆن تاریکایی شەو بەردەوام نابێت بەڵکو خۆری بەیانی هەر هەڵدێت.!

[1] - (الطلاق/٧)

(وَإِذَا مَرِضْتُ فَهُوَ يَشْفِينِ)[1]

کاتێك کەنەخۆش دەکەوم هەر ئەو شیفام دەدات واتە چاکم دەکاتەوە!.

لە کاتێکدا نەخۆشیت خودا تاقیتدەکاتەوە بۆ ئەوەی سەبر بگریت پاداشتی پێبداتەوە هەرچەند نەخۆشیەکەت قورس بێت وە هەر خۆشی شیفات بۆ دەنێرێت کەواتە دڵگران مەبە.

---

[1] - (الشعراء/٨٠).

(وُجوهٌ يومئذٍ ناضرةٌ * إلى رَبها ناظِرَةٌ).[1]

لـەو ڕۆژەدا هەندێك ڕووی گـەش و جــوان دەڕوانــە پــەروەردگــاريان!.

دەبێت چ شتێك خۆشتــربێت لــە بەهەشتا لـە بينينی پەروەردگــار!

ئــای چەندە تامەزرۆی ديداری پەروەردگــارين خودايە بەديدای خۆتمان شادبكەيت. آمين.

---

[1] - (القيامة (٢٢- ٢٣)

(فَاصْبِرْ إِنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ وَلَا يَسْتَخِفَّنَّكَ الذينَ لَا يُوقِنونَ)[1]

جا دان بەخۆتدا بگرە بێگومان بەڵێنی خوا ڕاستە با ئەوانەی بێ باوەڕن لە (ئایینی) ڕاست لات نەدەن و بێزارت نەکەن!.

هەر کەس لەسەر دینەکەت قسەی پێ وتی تۆ هەر زەردەخەنە بکەو بەردەوام بە لەسەر ڕێگای ڕاست.!

[1] - (الروم/٦٠)

(وَلَلأَخِرَةَ خَيرٌ لَكَ مِنَ الأُولَى)

بێگومان ژیانی دوارۆژ چاكترو باشتره بۆ تۆ لەژیانی دونیا!.

كەواتە ئەوەی كەدێت باشترە لەوەی كەرۆیشتوە!.

(وَلَسَوفَ يُعْطِيكَ رَبُكَ فَتَرَضَى)[١]

لەئایندەدا پەروەردگارت ئەوەندە نازو نیعمەتت پێدەبەخشێت كە زۆر پێی ڕازی و خۆشنوود دەبیت!.

كەواتە سەبر بگرە لەسەر ئەوشتەی ئاواتی بۆدەخوازیت ڕۆژێك دێت خوای گەورە پێت دەبەخشێت تۆش لەخۆشیدا دەست دەكەیت بەگریان.!

---

[١] - (الضحى ٤- ٥)

(وَأُزلِفَتِ الجَنَةُ اللِمُتَقِينَ غَيرَ بَعِيد(٣١)هَذَا مَا تُوعَدُونَ لِكُلِ أَوَابٍ حَفِيظ (٣٢) مَن خَشِيَ الرَحمنَ بِالغَيب وَجاءَ بِقَلبِ مُنيب(٣٣)أُدخُلُوهَا بِسَلام ذَلكَ يَومُ الخُلُود(٣٤)[١].

بەهەشت نزيك خراوەتەوە لەخواناس و پارێزكارو باوەڕداران، بێ ئەوەی دووربێت لێیان.

(٣٢) ئەمە ئەو بـەڵێنە بوو پێتان درابوو، بۆ هــەموو ئەو کەسانەی کە زۆر تەوبەکار و خۆپارێزن لە گوناهو نـافەرمانی خــوا.

(٣٣) هەرکەس لەخــوای میهرەبـان بترسێت و لەپەنهاندا خــۆی لـەگوناه بپارێزێت و بـەدڵێکی بەئـاگاو تەوبەکارەوە بــۆ بارەگای خوا بگەڕێتەوە.....

(جا بەو بــەختــەوەرانە دەوترێت):(٣٤) بـفەرمــوون بچنــە نـاو بەهەشتەوە لەگەڵ ئـاشتی و ئــارامی و هێمنیدا، ئا ئەوە ئیتر ڕۆژی نــەمری و نــەبــڕاوەیە.!

ئەمە مــزگــێــنیەکە لەلایــەن خــوای گەورەوە بۆ هـــەموو تــەوبەکاران ئای چـــەندە مزگێنیەکی بەنــرخ و بەبەهـــایە!!.

---

[١] - ق ٣١- ٣٤)

(لَئِن شَكَرتُمْ لَأَزِدَنَكُم..)[1]

ئەگەر شوکرانە بـژێری خـــوای گەورە بکەن لەسەر ئەو نیعمەتـانەی پێی داون ئـەوا بۆتـان زیـاد دەکات.

بیر بکەوە نازو نیعمەتی خوای گەورە چەندە زۆرە بەسەرتەوە سوپاسی خوای گەورە بکە کەلەشت ساغە کەفەقیرنیت کەکەم ئەندام نیت کەدەتوانی بخۆیت و بخۆیتەوە تام لەخواردن بکەی....هتد هەرگـیـز نیعمەتەکانی لەژماردن نایەت!

کەواتە شوکرانەی خودای گەورە بکە لەسەر ئەم هەموو نازو نیعمەتەی کەئێستا تێیدایت و زۆرێك لەخەڵکی لێی بێبەشن!.

---

[1] - (ابراهيم/٧).

(أَلَآ إِنَّ أَولِيآءَ اللهِ لا خَوفٌ عَلَيهِمْ وَلَاهُمْ يَحْزَنُونَ * الَّذِينَ ءَامَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ)[1]

ئــاگاداربن و هۆشیاربن کەدۆستەکانی خــودا لە دوارِۆژدا هیچ ترس و بیمێکیان لەسەر نیەو دڵ زویر و خــەفەتبــاریش نابن، ئەوانە ئەو کەسانەن کە باوەڕی تەواویان هێناوە و خۆشیان دەپارێزن (لەقەدەغەکراوەکانی خودا).

چــەندە بــەخــتەوەرن دۆستەکانی خـــودا لــە دوارِۆژدا!
ئایــە دۆستی خـــودای یـــان دۆستی شـــەیتان؟!
وەڵامەکەت لــەم ئـــایــەتەوە دەست دەکــەوێت!!.

[1] -(یونس ٦٢- ٦٣).

(وَتَوَكَّل عَلَى اللهِ وكَفَى بَاللهِ وكِيلاً)[1]

هـــەميشەو بـــەردەوام پشت بەخـــودا ببەســـتـە تەنـــها ئـــەوت بـــەسە پشتيـــوان و يـــاريدەدەرت بێت!.

جا ئەگەر ويستت كارێك بكەيت ئاوا تەنها پشت بەخوداى خۆت ببەستە چونكە پشت بەستنى بەندەكان زەليلى و سەرشۆڕييە !.

[1] - الاحزاب ٣

(يُدَبِّرُ الأَمْرَ مِنَ السَّمَاءِ إلى الأَرْضِ)[1]

خــوای گەورە هــەموو کاروبــارەکان بــەڕێوە دەبات لــە ئاسمانـــــەوە تــا زەوی (هــەتا ڕۆژی دوایی)

کەواتە بۆ چی خەفەت دەخۆیت لەکاتێکدا خودا دەفەرمووێ کاروبارەکانت لەدەست منن ئایە خودا زاناتر نیە بەوەی چ بۆتۆ باشە کەواتە کارەکانت بدە دەست خودا باشترین شتت بۆدەنێرێت!.

[1] - (السجدة/٥).

(إِنَّ الَّذِينَ ءَامَنُوا وَعَمِلُوا الصَّلِحَتِ أُلَئِكَ هُمْ خَيرُ الْبَرِيَّةِ)[1]

بەڕاستی ئەوانەی بڕوایان هێنا و کردەوە چاکەکانیان کرد، ئـا ئەوانە پـاکترین و چـاکترینی هـەموو دروستکراوێکن!.

کەواتە ئەی خوشک و برای بـڕوادار کردەوەی چاکە بکە بەقسەی کەس هەڵمەخەڵەتێ و لەڕێگای چاکەکان لامەدە تـاببیتە یەکێك لە چـاکترینی دروستکراوەکان لـەلای خـودا !.

---

[1] - (البينة/٧)

(وَرَحمَةِ وَسِعَتْ كُلَ شَيءٍ)[1]

ڕەحمەتـــی من ئـــەوەندە فـــراوانە هـــەموو شتێکی گـــرتۆتـــەوە!

خـــودایە گەر ڕەحـــمەتت هـــەموو شت بگرێتەوە ئـــەوە نـــائومێد نیم دڵنیام منیش دەگرێتەوە!

[1] - الاعراف ١٥٦

(قُلِ اللهَ يُنَجِّكُم مِّنْهَا وَمِنْ كُلِّ كَرْبٍ)[1]

ئەی محمد (صل الله علیه وسلم) پێیان بڵێ: خــودا لەو تــاریکیانەو لە هــەموو کۆسپێك ڕزگارتــان دەکات!.

ئەگەر لەئامانجەکانتدا هەر کۆسپێکت بۆهاتە پێش واز مەهێنە شکست مەخۆ سەرکەوتن بەبێ شکست بوونی نیە دووبارە هەستەوە سەرپێ خودا بەڵێنی داوە کەوا لەم کۆسپ و ناڕەحەتیە ڕزگارت دەکات.!

[1] - (الأنعام/٦٤/).

دەست بــە ئــاواتــەکانتەوە بگرە بـا مەحــاڵیش بێت،

تــەنها بــەهــێواشی بڵێ:

**(أَنَّ اللهَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدِيْرٌ)**[1]

خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.!

---

[1] -

دوو مژدەی زۆر خۆش لەلایەن خودای گەورەوە بۆ تۆ؟!

یەکەم/

(إِن تَنصُرُوا اللهَ يَنصُرْكُمْ)[1]

ئەگـەر ئێوە دینی خــوا سەربخەن ئـەوا خــوای گەورەش ئێوە سەر دەخــات!.

دووەم/

(وَمَا كَانَ اللهُ مُعَذِّبَهُم وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ)[2]

خوای گەورە سزاتان نادات ئەگەر ئێوە داوای لێخۆشبوون بکەن.!

کەواتە ئەی خوشک و برای بڕوادار هەستن دینی خوا سەرخەن
خوشکی بڕوادارم تۆ بەحیجابەکەت دینی خوا سەردەخەیت
وەسەیر بکە خودای گەورە سزات نادات ئەگەر ئێوە داوای لێخۆشبوونی لێبکەن!

---

١ -
٢ -

(وَلَقَدْ خَلَقْنَا فَوقَكُمْ سَبعَ طَرَآئِقَ وَمَا كُنَّا عَنِ الْخَلْقِ غَفِلِينَ)[1]

لەسەرووی ئێوە حەوت ئاسمانمان دروست کردووە یەک لەسەر یەك، وئێمە بێ ئاگا نین لە دروستکراوەکانی خۆمان وە ئەیانپارێزین و نایەڵین بەبێتەوە سەر زەوی!.

خودای گەورە ئاگای لەدڵیشتە بۆیە هەرگیز بێ هیوا مەبە.!

[1] - (المؤمنون/١٧/).

ئەتەوێ سەرکەوتوو بیت؟

هۆکاری سەرکەوتنت ئەمەیە!

(وَتُوبُوا إلى اللهِ جَمِيعًا أَيُّهَ الْمُؤمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ)[١]

هەمووتــان تــەوبــە بکەن و بگەڕێنەوە بــۆ لای خــوا ئەی ئیماندارەکان تــا ڕزگـــار و سەرکـــەوتووبن.!

---

[١] - (النور/٣١/).

ئەی هاورێی ئیماندارم،

دەبینم کەوا ماندوویت، بۆیە هاتووم مژدەی خوات بدەمێ تا ڕووحتی پێداپۆشم خودای گەورە کەدەفەرمووێ:

**(هُمْ دَرَجَاتٌ عِنْدَ الله)**

واتە: ئەوان بەقــەد پابەندبــوونیان پلەو مەنزڵگایــان دەبێت لەلای خــودا،

بۆیە باپلەی تۆ یەقینێکی بەرز بێت ، وەنیشانی خــودای بدە کەوا تۆ هەم خۆی هەم قەدەرەکانیت زۆر خــۆشدەوێت! تاکو ئەوەی ئــاواتی بۆدەخــوازی پێتی ببەخشێت، ئاخــۆ هــەر ئەو نییە پێمان دەفەرمووێت:

**(إِنِّي قَرِيب أُجِيب)**

من نزیکم وەڵامتان ئەدەمەوە؟!.

ئایە دەزانی ئەوانە کێن کە خـــوای گەورە خۆشی دەوێن؟!

(إِنَّ اللهَ يُحِبُّ التَوابِينَ وَيُحِبُّ المتُطَهِرِينَ)[1]!

بەڕاستی خوا تەوبەکاران و پـــاکانی خۆشدەوێت!.

(إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المُقْسِطِينَ)[2]!

بەڕاستی خوا دادپەروەر و ماف پەروەرانی خۆشدەوێت!.

(إِنَّ اللهَ يُحِبُّ المتُوَكِّلِينَ)[3]!

بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆشدەوێت کەپشتی پێدەبەستن!.

(إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفّاً كَأَنَهُم بُنْيَانٌ مَّرْصُوصٌ)[4]!

بەڕاستی خـوا ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کەدەجەنگن لەپێناو خوادا بەیەك ڕیز و یەك پارچە و یەك دڵ، چـــونکە هەر وەك کۆشکێکی بـــەرزی قایمی دارێـــژراون بە قـــوڕقوشـــم.!

---

[1] - (البقرة/٢٢٢/).

[2] - (المائدة/٤٢/)

[3] - (آل عمران/١٥٩/).

[4] -(الصف/٤).

(فإِنَّ اللهَ يُحِبُ المتُقِينَ! (آل عمران/٧٦)
بەڕاستی خــوا پارێزکاران و دیندارانی خۆشدەوێت!.

(و اللهُ يُحِبُ المُحسِنِينَ!)
خــوای گەورە چاکەکارانی خۆشدەوێت!.

(و اللهُ يُحِبُ الصَّابِرِينَ!)
خــوای گەورە ئارامگرانی خۆشدەوێت!.

(و اللهُ يُحِبُ المُطَّهِرِينَ!)
خــوای گەورە پــاکانی خۆشدەوێت!.
خوایە لــە خـۆشـەویستی خــۆتمان بـێ بـەش نـەکەی.
اللهم آمین یارب.

(فَمَن يَعْمَل مِثْقَالَ ذَرةٍ خَيراً يَرَهُ)[1]

جائەوەی بەقەدەر سەنگی گەردیلەیەك خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوە!.

کەواتە هیچ چاکەیەك بەکەم مەزانە ئەگەر چی بچووکیش بێت ڕەنگە بەهۆی ئەم چاکەیەوە تەرازووی چاکەت پێی قورس بێت و بچیتە بەهەشتەوە!.

---

[1]- (الزلزلة/٧/).

(إِذْ نَادَى رَبَّهُ نِداءً خَفِيًّا)[1]

كاتێك پاڕایەوە لەپەروەردگاری بە پاڕانەوەیەكی نهێنی و پەنامەكی.

خوای گەورە دەنگی بەزری نەكردووە بەمەرج بۆ پاڕانەوە لێی،
كەواتە بزانە خودا گوێی نەك لەدەنگتە بەڵكو گوێی لەترپەی دڵیشتە
كەچی تێدایە هەمووی دەبیستێ.!

---

[1] - (مريم/٣/)

**(لَا تَحْزَنُوا)** نـارەحەت مەبــن!

**(لَا تَقْنَطُوا)** بــێ هیــوا مەبــن!

**(لَا تَيأَسُوا)** بــێ ئـومێد مەبــن!

**(لَا تَـهِنُوا)** خـۆتان بەکەمر و لاواز مـەزانن!

**(لَا تَخَافُوا)** مــەتــرســێــن.!

قورئــان بانگمـان دەکات بــۆ ڕازیــبوون و گەشبینی و ئــومێد گــوێ بــۆ قورئـــان بــگرن لە هیچ مــەتــرسێن و خــەفــەتیش مــەخــۆن.!

(وَأَسِرُّوا قَوْلَكُمْ أَوِجْهَرُوا بِهِ إِنَهُ عَلِيْمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ)[1]

ئێوه قسه بەنهێنی یـان بەئاشكرا بكەن (بۆ خــوای گەورە یەكسانە)
چونكه ئەو خــوایە بێگومان زانـایە بەنهێنی نـاو سینگ و دڵەكان!.

ئەگەر چی زۆر هیلاكیت و ناتوانی نزاكانت دەرببڕیت بەڵام
بێگومانبە خــودا ئاگای لەدڵتە و ئەزانێ چی تێدایە!.

١ - (الملك/١٣/).

(إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ)

ڕۆژێك دێـت پێت دەوترێت: ئارامگرتنەکەت کۆتـایی پێهات!

فـەرموو پاداشتەکەی وەربگرە.!

ئەگەر بــە خەونەکانت نەگەیشتی ئەگەر ئەو شتەی دەتویست بــە دەستت نــەهێنا ئەگەر لە ژیــاندا تووشی بــەڵا و نارەحەتی و ئـازار هاتیت ئــەگەر شتێکت لــەدەستدا ئەوا دڵگران و خەفەتبار و بێ حەواس و بێ ئارام و بێ ئومێد مەبە ئــەزیــزم...

چــونکە خــودای گەورە دەفەرمووێت:

(وَعَسَىٰ أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ)

لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت!.

(وَعَسَىٰ أنْ تُحِبُوا شَيْئًا وَهُوَ شَرٌ لَّكُمْ)

لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت!.

(وَ اللهُ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ)

بێگومان خودا خۆی دەزانێت (خێرلەچی دایە) ئێوە نایزانن.!

(إِنَّا كَفَيْنَكَ الْمُسْتَهْزِءِينَ)

بەڕاستی ئێمە تــۆ دەپارێزین لەشەڕو پیلانی ئەو کەسانەی گاڵتە و لاقرتی دەکەن بە ئــاینەکەت!.

لەسەر دینی ئیسلام ئازارت دەدەن و گاڵتەت پێدەکەن چونکە حیجابیت بەڵام دڵنیابە خـــودا تــۆ دەپارێزێ و پشتت دەگرێ و دڵنەوایت دەکات وە ئـەوان زەرەرمەندن تـــۆش سەرکەوتـــوو سەرفـــرازیـــت.!

خودای گەورە دووجار دڵنیات دەکاتەوە و دەفەرموویت:

(فَإِنَّ مَعَ الْعُــسْرِ يُــسْرًا (٥)

بـەڕاستی لــەگەڵ هـەموو تـەنگانـەیەکدا خــۆشی و ئـاسانی دێت.

(إِنَّ مَــعَ الْعُــسرِ يُــسْرًا (٦)

بـێگومــان لـە ڕاستیدا لەگەڵ هـەموو تـەنگانـەیەکدا خــۆشی و ئـاسانی دێت!.

کــەواتـە دڵنیابـە نـاخــۆشیەکـانــت تـاسـەر نـین!.

هــەر وەکو چــۆن شەمەندەفـەرێك بەنـاو تونێلێکی تاریکدا دەڕوات بەڵام هــەر دەگاتەوە بەڕووناکایی ڕێگاکە.!

﴿إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّتٍ وَعُيُونٍ﴾[1]

بــەڕاستی پــارێزکــارانیش لــەباخەکان و کانیاوەکانــی بــەهەشتدا ژیــانی خــۆش دەبــە نــەسەر.

خــودایە بمانخە ڕیــزی پارێزکاران تــا لەبــەهــەشتەکەتدا بحەسێینەوە!.

اللهم آمين يارب العالمين.

---

[1] - (الذاريات/٥١/)

(إِنَّ الْحَسَنَاتِ يُذْهِبْنَ السَّيِّئَاتِ)[1]

بـەڕاستی کردەوە چاکەکـان کردارە خراپەکـان لادەبـات و گوناهەکـان دەشـــۆنـــەوە!.

پێویستە هەوڵبدەیـن کردەوەی چاك بکەین جا سەیر بکە خودا چەندە بە ڕەحمەو چەندە تـۆی خـــۆشدەوێت خـــودا هـــەرگیز نایـــەوێ بەندەکەی سزابدات دەیەوێت بەهـــۆی کارو کرداری چاکەوە لەگوناهەکـانت خـــۆشبێت و بیسڕێتەوە تـاوەکو بەپـاکی بچیەوە لای خـــۆی.!

[1] - (هود/١١٤)

# کۆتـــایـــی

له کۆتایدا هیوادارم سوودتان بینیبێن لەم نامیللکەیە و دڵتان ئۆخشن بوو‌بێت بە کەلامەکەی خــوای پەروەردگار وە هیدایەتتان وەرگرتبێت زیاتر بگەڕێنەوە ناو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و کارکردن پێی و خوێندنەوەی بەردەوام چونکە قورئان لەڕۆژی دوای شایەتیت بۆدەدات و پلەت بەرز دەکاتەوە کە بەهەر ئایەتێك پلەیەک بەرز دەبیتەوە وە شوێنی تۆ لەکۆتا ئایەتە کەدەیخوێنی.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (خَيرُكُم مَن تَعَلَّمَ الْقُرآنَ وَ عَلَمَهُ)[١]

واتە: بــاشترینتان ئەو کەسەیە کە فێری قورئــانی پیرۆز دەبێت و خەڵکیش فێر دەکات. خوای گەورە لەکەم و کوڕیەکانمان ببورێت، داواکارم هەریەکێك ئەم نامیللکەیە دەخوێنێتەوە با لەدوعای خێر بێ بەشمان نەکات، خودای گەورە پاداشتتان بداتەوە اللهم امین یارب.

وَآخِرُ دَعْوانَا أن الْحَمْدُلله رَبِّ العَالَمِين
وَصَل اللهُ على نَبِينَا مُحَمَدٍ وَعَلَى آل وَصَحبِهِ وَسَلَم.

---

١ - رواه البخاري.